# بەڵێنی لیبرالیزمی عەرەبی

**نووسيني: تامارا كۆفمان ويتس**

لێکۆڵەرەوە ، لە بواری دیراساتی سیاسەتی دەرەکی

سەرچاوە : گۆڤاری پۆلیسی ریڤیو، ژمارە ١٢٥ی مانگی حوزەیران و تەمموزی ٢٠٠٤

وەرگێڕانی : بێوار عەبدولرەحمان

کوردستان – ٢٠٠٥


**ناوی کتێب: بەڵێنی لیبرالیزمی عەرەبی**

– نووسینی: تامارا کۆفمان ویتس

ئەندامی لێکۆڵەرەوە , لە توێژینەوەکانی سیاسەتی دەرەوە

بە ڕەزامەندی گۆڤاری پۆلیسی ریڤیۆ , دووبارە لە چاپ دراوەتەوە .

– وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: بێوار عەبدولرەحمان

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سدبق

سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– پیتچنین: گۆڤاری گولان

– تیراژ: ٥٠٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: ٥١٠

-- چاپی یەکەم ٢٠٠٥

– نرخ: ٧٥٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ١٧ – (١٢٠)



ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311

www.mukiryani.com

## پێشەکی

ئەم بابەتەی جێی باسی ئەم نامیلکەیەیە دەچێتە خانەی ئەو زنجیرە لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەوە کە لە نەوەدەکانەوە لە ولاْتانی ڕۆژئاوا ئەنجام دەدرێن سەبارەت بە پرسەکانی دیموکراسی و لیبرالیزم و ئەو کۆسپانەی دێنە بەردەم جێبەجێکردنی لە ولاْت و ژینگە جۆراوجۆرەکانی دنیادا، بە تایبەتی لە ولاْتانی ئەمەریکای لاتین و ئەفریقیا و ئاسیا دا. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لە م لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەدا, ولاْتە عەرەبی و ئیسلامییەکان جێگەیەکی تایبەتیان بۆ دانراوە بەو پێیەی لە پرۆسەی دیموکراتیزەکردندا _چ جای لیبرالیزەکردن_ بەر ئەو شەپۆڵە جیهانییەش نەکەوتوون کە بە(شە پۆلی سێیەم )ی دیموکراسی ناودەبرێت و ساڵی ١٩٧٤ یش کە لە پورتوگال گۆڕانکاریی سیاسی بە کودەتایەك بە ئاراستەی دیموکراسی دەستی پێکرد، بە دەسپێکی ئەو شەپۆڵە دادەنرێت، کە دوای ئەوە ژمارەیەکی زۆر لە ولاْتانی ئەمەریکای لاتین و ئاسیای دوور و ئەفریقیا سەرکەوتووانە هەنگاویان بەرەو دیموکراسی نا و تا ئێستاش ئەو پرۆسەیە بەردەوامە. گرنگی ئەم بابەتەش لەوەوە دێت کە باس لە گرفت و ئالۆزییەکانی پرۆسەی دیموکراسی و لیبرالیزم لە ولاْتانی عەرەب دەکات و ئەو ئەشکالیەت و دووفاقییەش شی دەکاتەوە کە ولاْتانی رۆژاوا لەم ڕووەوە دووچاری بوون، بەوەی لە لایەکەوە بەرژەوەندییەکی زۆریان لە گەڵ حکومەتە عەرەبییەکان هەیە کە سەرلەبەریان ڕژێمی دیکتاتۆری و سەرکوتگەرن و لە لایەکی تریشەوە دەیانەوێت پاڵپشتی لە هێزە دیموکراسی و لیبرالی و



ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی عەرەب بکەن، بەمەبەستی وشککردنی ئەو زۆنگاوانەی توندڕەوی تێیدا نەشونوما دەکات بۆ ئەوەی خۆیان و دنیا لە ئەگەری دووبارەبوونەوەی کارەساتی هاوچەشنی ١١ی سێپتێمبەر بپارێزن.

ئەم دوو دژە چۆن بەیەکەوە دەگونجێنرێن ؟

تامارا کوفمان لەم لێکۆڵینەوەیەیدا هەوڵ دەدات وەلاْم بەم پرسیارە بداتەوە.هیوادارم ئەم وەرگێڕانەی منیش بەشدارییەکی بچوك بکات لە پتر ئاشنابوونی خوێنەری کورد بەم جۆرە بابەتە گرنگانە بۆ ئەمڕۆی مەسەلەکەمان کە لەگەڵ بزاڤی دیموکراسی ودژە تیرۆری ناوچەکە و سەرتاسەری دنیا تێکەڵکێش بووە. بە ئومێدی ئەوەی هەوڵی تری بەدوادا بێت لە وەرگێڕانی زنجیرەیەك لە بابەت و لێکۆڵینەوەی سیاسی لە بواری دیموکراسی و لیبرالیزم.

بێوار عەبدولرەحمان

بەپێی گوتەی (خانەی ئازادی)، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بواری ئازادییەکانەوە لە ریزی هەرە دواوەی جیهان دێت، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تەنانەت بەرهەڵستی شەپۆلی سێیەمی ئەو گۆڕانکارییە دیموکراسییانەشی کرد کە لە ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکاندا لە ئاسیا و ئەمەریکای لاتین و ئەوروپای رۆژهەڵات بڵاوبووەوە. ئیستسنابوونی عەرەب لە دیموکراسی، بووەتە مایەی بەرهەمهێنانی قوتابخانەیەکی ئەدەبیی تایبەتی لە پاساو هێنانەوە یا پۆزەش هێنانەوە، بەڵام رەنگە چەرخی پاساو هێنانەوەی عەرەب بەسەر چووبێت. وێڕای ئەو بەڵێنە حەماسییە سەرسورهێنەرانەی ئیدارەی بوش دەیاندات، دەبێ هێشتا زۆر چاوەڕێ بین تاوەکو ئەوە بە چاوی خۆمان ببینین کە داخوا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێتە مامانی ئایندەی دیموکراسی عەرەب، یاخود تەنیا وەکو تەماشاکەرێك دەوەستێت؟ زۆر لەشیکەرەوەکان بەگەرمی پێشوازیان لەو بەڵێنەی بوش کرد کە لە نۆڤبمەری ٢٠٠٣ دای سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی دیموکراسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و وەك دووبارە داڕشتنەوەیەکی رادیکاڵانەی سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر بەناوچەکە وەسفیان کرد. هەرچەندە ئەم بەڵێنە شتێکی نوێ نییە، بەڵکو جەختکرنەوەی ئیدارەی بوش لەسەر گۆڕانکاری لە سیاسەتەکەی بەرامبەر جیهانی عەرەب تەنانەت دوو ساڵ بەر لە شەڕی عێراقیش دەستی پێکردبوو، لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٢ دا لە (وێست پۆینت)دا سەرۆك بوش بە راشکاوی رایگەیاند: "سەدەی بیستەم کۆتایی هات، بەڵام تاکە مۆدێلێك کە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بە



زیندوویی مایەوە بریتی بوو لە: پرینسیپی رێزگرتن لە خواستە حاشاهەڵنەگرەکانی مرۆڤ، سەروەریی یاسا، سنووردانان بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت ، رێزگرتن لە ئافرەت و موڵکدارێتی تایبەت و ئازادی رادەربڕین و هاویەکی لەبەردەم دادگادا و لێبوردەیی ئایینی. دایکان و باوکان و منداڵان لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلام و دنیادا، هەمان نیگەرانی و خواستیان هەیە".

سەرۆك بوش لە (٢٦)ی شوباتی ٢٠٠٣ لە ئاستانەی شەڕی عێراقدا ،لەبەردەم (پەیمانگای ئەنتەرپرایزی ئەمەریکی)دا لە گفتوگۆیەکەیدا سەبارەت بە زەروورەت و گرنگی دیموکراتیزەکردنی جیهانی عەرەب ،بە ڕاشکاوی رایگەیاند کەوا "گەلە ئازاد و سەقامگیرەکان ئایدیۆلۆژیای مەرگ بەرهەم ناهێنن".

هەروەك ئەم لێخواستنەوەیەی سەرەوە دەیسەلمێنێت ، حکومەتی ئەمەریکا بە زەروورەتی دیموکراتیزە کردنی رۆهەڵاتی ناوەڕاست قایل بووە تاوەکو ئەو گۆڵ و زەلکاوانە وشك بکات کە تیرۆریزمی ئیسلامی گەرای تێدا دەنێتەوە و چەکەرەی تێدا دەکات.

"ستراتیژیەتی ئاییندەیی ئازادی"ی سەرۆك بۆش بریتییە لە هەوڵی یەکەمی ئیدارەی بوش بۆ روونکردنەوەی تێڕوانین و دیدگای پۆزەتیڤانەی ئەمەریکا سەبارەت بە رێکخستنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دوای سەدامدا. لە هەمانکاتدا و بە ئاگاییەکی زۆریشەوە ئەمە ستراتیژییەکە بۆ بردنەوەی جەنگی دژە تیرۆر لە رێگەی گۆڕینی سیاسەتە چەوتەکانی ئەمەریکا بەرامبەر بە ناوچەکە، کە_بە پێی دیدگای سەرۆك بۆش _ بوونەتە هۆی دروستبوونی خەڵکێکی

چەوساوە و ناڕازی وا کە بوونەتە نێچیرێکی ئاسانی ئایدیۆلۆژییە توندڕەوەکان. کەوایە (ستراتیژی ئاییندەیی) بریتییە لە روخساری سیاسەتێکی پێشبینکەرانە و پێشلێگرەوەی دژە تیرۆری ئەمەریکا. قووڵتر و پڕماناتریش لە وەی ئەمە هەوڵێك بێت بۆ (راکێشانی دڵ و مێشکی ) ئەمەریکییەکان خۆیان، ئەوا ئەمە هەوڵێکە بۆ( راکێشانی دڵ و مێشکی) عەرەبەکان سەبارەت بە پیادەکردنی بەها و خووڕەوشتە ئەمەریکییەکان، هەروەها بۆ گەیشتنە ئەو قەناعەتەی داخوا دواجار عەرەبەکان ئەمەریکا و سیاسەتەکەی قبوڵ دەکەن یان نا؟

لەم گۆشە نیگایەوە دیموکراسی بۆ وڵاتانی عەرەب و جیهانی ئیسلام زۆر پێویستە، ئەمەش بۆ پەراوێزکردنی ئیسلامییە توندڕەوەکان و نەهێشتنی سیاسەتی توندڕەوی،بۆ ئەوەی ئەمەریکا بۆ ئەمەریکییەکان ئارامتر بکرێت.

بەڵام ئەم رێگە تایبەتییە دژە تیرۆرەی تیوری ( دیموکراسی ئاشتییانە)، تاکە ئاراستەکەرێکی سیاسەتی نوێی ئیدارەی ئەمەریکی نییە. بەلکو زەروورەتی هاندانی چاکسازی لە نێو عەرەبدا ڕەگی لەو گۆڕانکارییە حەتمییەدا داکوتاوە کە لە ساڵانی داهاتوودا لە بواری رێسا و بنەمایەکانی سیاسەتی عەرەبی و پێوەندییەکانی عەرەب و ئەمەریکادا ، خۆی فەرز دەکات.لە کاتێکدا بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هێشتنەوەی ئەو رژێمە قائیمانەی دەخواست کە لە توانایاندا بوو ئارامی و



سەقامگیری ناوچەکە بپارێزن، بەدەرکەوت کە ئەو رژێمە دیفاکتۆیانە لەسەر بنەمای هەرچی فشۆڵتر و لاوازتر دەوەستان.

رژانە ناوی ژمارەیەکی هەرچی زیاتری لاوان بۆ ناو هێزی کارەوە و، ئابوورییەکی چەقبەستووی ئاراستەکراو لەلایەن دەوڵەتەوە و، رۆتینی بیروکراتی و ئیداری و، فەسادێکی ئیداری بەربڵاو ، هەموو ئەمانە دەبنە مایەی گەورەتربوونی هەڕەشەی ناسەقامگیری و, لای هاووڵاتی عەرەب بۆشایی لە نێوان خواست و واقیع فراوانتر دەکەن.

لەگەڵ بەبنبەست گەیشتن و کەمبوونەوەی کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای یەکێتی عەرەب(پان- عەرەبیزم ) وەك پاساوێك بۆ شەرعییەتدان بە رژێمە عەرەبییەکان و خۆ شاردنەوەیان لە داخوازییەکانی هاووڵاتییان بەو پاساوەوە ، هەروەها لەگەڵ پەرەسەندنی سەرچاوە سەربەخۆکانی زانیاری لە رێگەی سەتەلایت و ئەنتەرنێت و ڤیدیۆ و کاسێتەکانەوە، ئەوا نارەزایی جەماوەریش بەرامبەر سەرکردە خۆماڵییەکانی وڵاتانی عەرەب پەرەی سەندووە.بەڵام لە هەمان کاتدا ڕووداوەکانی ئیسرائیل و عێراق و پشتگیری حەیاتییانەی ئەمەریکا بۆ دەسەڵاتدارە ئۆتۆکراتەکانی عەرەب، کارێکی وای کردووە کە لە (١٠) ساڵی رابردوودا شەپۆلێکی دژە ئەمەریکایی لە ناوچەکەدا پەرە بسێنێت ، کە زۆر لە رژێمە عەرەبیەکانیش بەشێوەیەکی خراپ سوود لەم شەپۆڵە وەردەگرن بۆ چەواشەکردنی جەماوەری عەرەب و دوورخستنەوەیان لە کێشە و گرفتە ناوخۆییە ئاڵۆزەکانی وڵاتەکانیان.

بە کورتی، سیاسەتی هێشتنەوەی ئەمری واقیع لە ناوچەدا چی دی توانای مانەوەی لەبەردا نەماوە، هەروەها بەدەستهێنانەوەی هاوسەنگی لە پێوەندییەکانی عەرەب و ئەمەریکا پێویستی بە گۆڕانکاریی بە پەلە هەیە لە ئاییندەیەکی نزیکدا. پێویستی هەرچی زیاتری پرسە عەرەبییە ناوخۆییەکان هێزی بزوێنەری پشت ئاماژە پێدانی بەردەوامی خەڵك بوون بە راپۆرتی پەرەپێدانی مرۆیی عەرەب، کە تێیدا کۆمەڵێك لە شارەزایانی عەرەب گلەییان لە فەشەلهێنانی پرۆسەی پێشکەوتن کردوە لە بوارەکانی ئازادی و زانیاری و پایەی ئافرەتدا. بەڵام رەنگە ئەو گۆڕانکارییە حەتمیانەی لە سیاسەتی عەرەبیدا بەڕێوەن، دیموکراسی لەگەڵ خۆیان نەهێنن. فەشەل هێنانی ئەمەریکاش لە شکڵ پێدانی ئەم گۆڕانکارییانە، بۆ چەندین دەیەی داهاتوو هەلێکی گرنگ لەدەست ئەمەریکا دەدەن و هەڕەشە لە کرۆکی ستراتیژی و بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا دەکەن, بەتایبەتی ئەگەر حکومەتەکانی ناوچە نەتوانن بەسەرکەوتوویی بەرەو رووی تەحەدیاتە هەراشبووەکانیان ببنەوە.

کەوایە، ئایدیالیزم و ریالیزم هەردووکیان سیاسەتی ئەمەریکایان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرەو یەك ئاراستە بردووە ئەویش بریتییە لە: هاندانی گۆڕانێکی ناوچەیی بەرەو پێشکەوتنی دیموکراسی، بەهاکانی ئازادی، بازاڕە ئازادەکان کە دەبنە مایەی فەرهەمکردنی هەل و ئاستێکی بەرزتری ژیان، و هێنانە ئارای زەمینەی گەشەسەندنی خیتابێکی میانڕەوانەتری سیاسی و، هاندانی سەرهەڵدانی ئیدارەیەکی عاقڵانە و لێهاتوو و بەرپرسیار لە



بڕیارەکانی و، تێهەڵکێشانی ناوچەکە لە تۆڕێکی جیهانی فراوانتری وڵاتە پێشکەوتووە بە رۆژاواییبووەکان.

تاوەکو ئێستا ستراتیژی ئاییندەیی ئیدارەی بوش بۆ ئازادی – ئەمەش بۆ بەپیرەوەچونی ئەو شکستە دیارەی (١١)ی سێپتەمبەر– چوار رەگەزی کۆنکرێتی لە خۆ دەگرێت:

_پرۆژەی هاوبەشێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست IMPI کە لە دیسەمبەری (٢٠٠٢) راگەیەندرا بۆ پشتگیری کردن و یارمەتیدانی گرووپەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی عەرەبی و هاندانی چاکسازییە ئابووری و پەروەردەیی و سیاسییەکانی بوو, هەروەك بۆ بەهێزکردنی پایەی ئافرەت بوو.

_هەروەها لە پاییزی (٢٠٠٣) دا، بۆش بانگەوازی بۆ دامەزراندنی (ناوچەی بازرگانی ئازادی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٠) کرد، تاوەکو ئێستا "ناوچە" کە تەنیا ئیمزاکردنی رێکەوتنامەی بازرگانی ئازاد لەگەڵ ئوردن و مەغریب و وتووێژ لەگەڵ بەحرەینی لێکەوتۆتەوە.

هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکان لە رێگەی بەرنامەی (MEPI)ەوە پاڵپشتی ئیشتراکی ئەندامێتی چەند وڵاتێکی عەرەبیش لە رێکخراوی بازرگانیی جیهانی (WTO) دەکات.

– لە ماوەیەکی نزیکتردا لەکانوونی دووەمی ئەمساڵدا، ئیدارەی بووش لەسەر رێگەی نزیکە بوونەوە و پاڵپشتییەکی زۆرتر لە دیموکراسی، پێشنیاری دوو هێندەکردنی کۆمەکی دارایی کرد بە بەرنامەی "باربووی نیشتمانی بۆ دێموکراسی NED" کرد کە

بنەمایەکە بۆ هاوکاری حکومەتی ئەمەریکا بە لێکۆڵینەوە و چالاکیی بواری دیموکراسی.

-دواجار، وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ ئەوروپییەکان وتوویژ لەسەر چەند پرنسیپێکی هاوبەش و زنجیرە دەزگایەکی هەماهەنگی دەکات کە دەبێتە ڕێگا پێشاندەرێك و دەلیلێك بۆ چۆنێتی مامەڵەکردنی ڕۆژئاوا لەگەڵ حکومەتە عەرەبییەکان لە بوارەکانی ئابووری و دیپلۆماسی و بەرگریدا.

بەڵام ئەو سیاسەتەی وەك هەیکەلێکی سیاسی تازە بابەت دێتە بەرچاو لە ڕاستیدا پتر بەرنامەیەکی تێکەڵ پێکەڵە کە هێشتا لەرزۆکە و پاشەڕۆژی دیار نییە، هەروەك پێشبینی دەکرا، بەرنامە نوێییەکە کەوتۆتە بەر پەلامارێکی نێودەوڵەتییەوە، بە ئاشکرایی لەلایەن دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە ڕەت کراوەتەوە. هەروەها لەلایەن دیپلۆماسییەتی ئەرووپییەوە بەرهەڵستی لێدوەدەکرێت، ئەوانەی "ئیجماع" و "هاوبەشێتی" خۆی لەخۆیدا بۆیان گرنگە، هەروەها ئەوانەی مەسەلەی بەرەورووبوونەوەی دەسەڵاتە ئیستبدادییەکانی هاوسێ عەرەبەکانیان لەلا ئەولەوییەتێکی لە پێشی نییە. لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە بە شێوەیەکی بەردەوام لەناوخۆی ئیدارەشەوە فەرامۆش دەکرێت و پەراوێز دەخرێت ئەویش بە هۆی : کێبەرکێ و پێکدادانێکی زۆری بەرژەوەندییەکان، چەقبەستوویی بیرۆکراتی و، خۆشباوەڕیی لە چۆنێتی جێبەجێکردنی ستراتیژەکە .

بەوەی ئەرك و هەوڵەکانی ئەمەریکا لە داڕشتنی ستراتیژێکی ئەمەریکی هەماهەنگ و کاریگەر بۆ هاندان و پێشخستنی دیموکراسی لە وڵاتانی عەرەبدا شکستیان هێناوە ، ئەمە وا بە



ئاسانی هەڵگەڕانەوەی ئەو دان پێدانانەی سەرۆك بوش ناگەیەنێ کە لە وتارەکەیدا لە (٦)ی نۆڤمبەری ٢٠٠٣دا وەك: (٦٠) ساڵ لە پۆزش هێنانەوە و بوونە هۆی نەبوونی ئازادی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا) ئاماژەی پێدا ، لەوەش خراپتر، پراکتیزە کردنێکی سست و لاوازی ئەو سیاسەتە، ڕەنگدانەوەی بوونی دووفاقی و ناڕۆشنی دیدگا و هەڵوێستی ئەمەریکاشە بەرامبەر بە دیموکراسی لەم ناوچە پڕ کێشەیەی جیهاندا، تاوەکو ئەم ناڕۆشنی ڕوئیایەش چارەسەر نەکرێت ئەوا ئەمەریکا ناتوانێت وا بە ئاسانی متمانەی چاکسازە گومانکەرە دوو دڵەکانی عەرەب وەرگرێتەوە. تاوەکو ئەمەریکاش نەتوانێت هاوپەیمانی کاریگەر لەناو دیموکراتخوازەکانی جیهانی عەرەب پەیدا بکات، ئەوا ناتوانێ ئومێدی هیچ هاوکاری و یارمەتییەك بێت لە پرۆسەی بە دیموکراسی کردنی عەرەبدا.

## گرفتە ئاڵۆزەکانی دیموکراسی لە جیهانی عەرەبدا

هەوڵەکانی پێشووی ئەمەریکا بۆ هاندانی دیموکراسی لە جیهانی عەرەبدا دوو گرفت بەربینگیان گرتووە کە زۆر لە چاودێران پێیان وایە کەوا بە ئاسانی چارەسەر ناکرێن و سەرکەوتن بەدەست ناهێنن ، گرفتی یەکەمیان دەکرێت لە سەرکەوتنی ساڵی (١٩٩١) پارتە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکانی جەزائیر لەیەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانیی ئازاددا، بەرجەستە و کورت بکرێتەوە، کە لە ئەنجامدا بووە مایەی سنووردانان بۆ پرۆسەی دیموکراتیزەکردن لەلایەن سوپای جەزائیرەوە، ئەمەریکا وەك زۆر لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان پشتگیری

کودەتا سەربازییەکەیان کرد و پێیان لە ئاکامی هەڵبژاردنەکە باشتر بوو.

"کێشەی جەزائیر" کە دیپلۆماتی شارەزا ئیدوارد دریجان زۆر بە کورتی بە "یەك پیاو.. یەك دەنگ.. یەك جار" وەسفی دەکات، وەك تارماییەك دیدگای سیاسەتمەدارە ئەمەریکاییەکانی لە چوارچێوە داوە سەبارەت بەوەی کە دیموکراسی چی بۆ جیهانی عەرەب لەگەڵ خۆی دێنێت: حکومەتێکی ئیسلامی هەڵبژێردراوی شەرعی بەڵام دژە ئەمەریکایی و دژە دیموکراسی لە تێڕوانینەکانیدا.

گرفتی دووەمیان ئەوەیە ئەرك و تێکۆشانی ئەمەریکا بۆ هاندانی سیاسەتێکی ئازاد لە وڵاتانی عەرەبدا، بەشێوەیەکی تەقلیدی کەوتۆتە ژێر کاریگەری بەرژەوەندییە کێبرکێیەکانەوە.

لەوانەیە داواکردن و فشارهێنان بۆ گۆڕانکاری دیموکراسی لە وڵاتی رەفتار خراپی وەك سوریا و لیبیا، زۆر ئاسان بێت و لە سەر حسابی دۆڕاندنی هیچ بەرژەوەندییەکی تر نەبێت، بەڵام رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پڕە لەو رژێمانەی کە ئەمەریکا بۆ ماوەیەکی زۆر لە بواری ئەمنی و ئابووری جۆراوجۆردا زۆر کار و هەماهەنگی لەگەڵ کردوون، بۆ نموونە لە شەڕی دژە تیرۆردا، لەبەر ئەم هۆیە بەشێوەیەکی بەردەوام حکومەتی ئەمەریکا گرنگییەکی کەمتری بە مەسەلەکانی حوکمڕانی و مافەکانی مرۆڤ داوە لە چاو مەسەلەی جەوهەری وەك شەڕی سارد و پرۆسەی ئاشتی نێوان عەرەب و ئیسرائیل.بۆیە لە کاتێکدا پێشێلکارییەکانی ماف مرۆڤ و چەوساندنەوەی ئایینی لە وڵاتانی عەرەبدا لە راپۆرتە ساڵانەییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکادا بەشێوەیەکی رێکوپێك ئاماژەیان پێکراوە، بەڵام لە



وتووێژە رووبەڕووەکانی نێوان ئیدارەی ئەمەریکی و سەرانی ئەو وڵاتانەدا، لە ئەجێندای کۆبوونەوەکان خراونەتە پەراوێزەوە.

بۆ خۆپاراستن لە مەترسیی سەرکەوتنی ئیسلامییەکان و ئەو بارگرانییەی پێشخستنی ئەولەوییەتی دیموکراسی بەسەر ئامانجە هەنووکەییەکانی تردا دەیهێنێتە پێشەوە، ئەرك و هەوڵەکانی پێشووی چاکسازیی حکومەتی ئەمەریکا بەشێوەیەکی گشتی زۆر ناچیز بوونە و بە راوێژکردنێکی تەواو لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا ئەنجام دراون کە خۆیان ئامانجی ئەو گۆڕانکارییە دیموکراسییانە بوونە، هەربۆیەش ئەفزەلیەتێکی پتر بە پێشکەشکردنی هاوکاری تەکنیکی بە دامودەزگا حکومەتییەکان دراوە، زیاتر لەوەی بە پاڵپشتیکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییە ناحکومییەکان دراوە. کۆمەککردن بە (دیموکراسی و ئیدارەدان) پێشتر و ئێستاش بەشێکی کەمی بەرنامەی گەورەی (ئاژانسی گەشەسەندنی جیهانی AID) بووە بۆ ناوچەکە، بەوەی زۆرتر مەیلی بایەخدانی بە بەرنامەکانی چاودێری تەندروستی و پەروەردە و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانی تر ی هەبووە.

لە سەرەتای دامەزراندنی MEPI (بەرنامەی هاوبەشێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) دا، لەلایەن (لیزا چینی) جێگری یاریدەدەری ئەوسای وەزیری دەرەوە و کچی جێگری سەرۆکی ئەمەریکا (دیك چینی)، سەرۆکایەتی دەکرا کە بووە مایەی راکێشانی پاڵپشتییەکی گەورەی سیاسی تاوەکو تەرکیزێکی گەورە بکاتە سەر دیموکراسی.

زۆر بە زوویی بەرنامەکە توانیی سەرچاوەی دارایی و ستافێکی باش کۆبکاتەوە، سەرمایەی سەرەتایی بەرنامەکە (۲۹$) بیست و نۆ ملیۆن دۆلار بوو کە کۆمەکی وەزارەتی دەرەوە بوو یەکسەر (۱۰۰$) سەد

ملیۆن دۆلاری تری خرایە سەر لەلایەن بەرنامەی پاڵپشتی دارایی لە ناکاوی تەرخانکراو بۆ جەنگی عێراق کە لە ئازاری ٢٠٠٣ بڕیاری لەسەردرا، هەروەها ئیدارەی بوشیش داوای ١٤٥$ سەد و چل و ملیۆن دۆلاری تری بۆ بەرنامەکە کرد لە چوارچێوەی بودجەی ساڵی دارایی ٢٠٠٤، هەرچەندە لیژنەی تەرخانکردنی کۆنگرێس بڕەکەی بۆ (٤٥) ملیۆن دۆلار بەهەنجەتی ئەوەی ئەم دووبارە کراوەی هەندێ بەرنامەی هاوکاری ترە و بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI پتر بە تێرمی گشتی پێناسەی خۆی کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا MEPI ستافێکی بەهێزی کۆکردەوە و دوو ئۆفیسی مەیدانی لە تونس و ئەبوزەبی کردووە. بە هەمووی MEPI نزیکەی ١٥٠$ سەدوپەنجا ملیۆن دۆلاری هەیە بۆ ساڵی دارایی (٢٠٠٤)، کە بە مەبلەغێکی گەورە دێتە بەرچاو بەڵام لەراستیدا هەر تاکێکی عەرەب لە ژن و پیاو و منداڵ (٥٨) سەنتی بەردەکەوێت. کەوایە مەبەست لە داهێنانی بەرنامەی MEPI بە گوێرەی قەبارەی بودجەکەی نییە، بەڵکو لە نەهجەکەیدایە، بەشێوەیەکی روونتر لە نەهجە سیاسییەکەیدایە کە بە مەبەستی گۆڕینی دیموکراسی داڕێژراوە، هەروەها بۆ راکێشانی ئەکتەرە ناحکومییەکانی ناو کۆمەڵگەی عەرەب دانراوە. بەڵام بەداخەوە بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کەوا لە پراکتیکدا بەرنامەی MEPI (هاوبەشێتی لەگەڵ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) یش خۆی لە کەرتی ناحکومی عەرەب بە دوور دەگرێت و زۆربەی پرۆگرامەکانیشی لینکێکی لاوازیان لەگەڵ دیموکراسی هەیە.

لێوردبوونەوەیەکی کەم لە ئەولەوییەتەکانی خەرجییەکانی بەرنامەی هاوبەشێتی (MEPI) گرفتەکانمان بۆ بەدیار دەخات. لە



(١٥) مانگی یەکەمی کارەکانیدا، بەرنامەی هاوبەشێتی بڕی ٩٨$ نەوەد و هەشت ملیۆن دۆلاری، بۆ کۆمەکی تەرخانکردووە ئەمەش بەپێی ئەو زانیارییەی لە سایتی ئاشکرای خۆیان بڵاویان کردۆتەوە.

زۆربەی هەرەزۆری کۆمەکیپێکردنی بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI واتە پتر لە ٧٠٪ی دراوە بە هەندێك پرۆگرامی وا کەوا یا راستەوخۆ لە قازانجی حکومەتە عەرەبییەکاندا بووە (لە چالاکی وەك وەرگێڕانی بەڵگەنامەکانەوە بگرە تا تایپکردنی تۆماری دادگاکان تا پێداچوونەوەی پرۆگرامی خوێندنی قوتابخانەکان) یاخود بۆ سیمینار و خولی راهێنانی بەرپرسە ئیدارییەکانی حکومەتەکان بووە. لەسەدا ١٧٪ی کۆمەکییەکەش بۆ ئەو رێکخراوە ناحکومییە ئەمەریکییە یا عەرەبییانە تەرخانکراوە کە لە ناوچەکەدا کاردەکەن، لە (٥,٢٪) بۆ بنیاتنانی کەرتی تایبەتی عەرەبی و هاندانی پێوەندی ئیشکردنی (بزنس)ی نێوان عەرەب و ئەمەریکا سەرفکراوە. تەنیا ٣,٢ ملیۆن دۆلار واتە (٣,٣٪) ی پارەی بەرنامەی هاوبەشێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست MEPI بۆ یارمەتیدانی رێکخراوە ناحکومییەکان بە مەبەستی فراوانکردنی کارەکانیان لە بوارەکانی یاسای خێزان و دژی فەساددا، لەناوچەکەدا تەرخانکراوە.

ئەم جەختکردنەوە کەم و لاوازە بۆ سەر کەرتی قازانج–نەداری عەرەبی تا رادەیەکی زۆر ئەنجامی ئەوەیە کەوا بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI لەناو جوغزی نەك لە دەرەوەی ئەو سنوورانەدا کار دەکات کە لەلایەن حکومەتە عەرەبییەکانەوە دانراوە. لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا رێکخراوە ناحکومییەکان بەشێوەیەکی توند سنووردارکراون، لە زۆر وڵاتی تریشدا رێگەیان پێ نادرێت کەوا

کۆمەکی بێگانە وەردەگرن. بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI رەنگە نەتوانێت لە ڕێگەی پاڵپشتیکردنێکی نابەرامبەری بەراوردنەکراوی ئەم چینە بیروکراتەی کە ئێستا لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتەکاندایە، چاوەڕێی پێشکەوتن بێت لە پێشخستنی کۆمەڵگەی مەدەنی عەرەبی وەك ئیدیعای بۆ دەکات.

**خەرجییەکانی بەرنامەی (MEPI) بۆساڵی دارایی٢٠٠٢-٢٠٠٣**

| ستوون | خەرجیی ساڵی دارایی ٢٠٠٢ | خەرجیی ساڵی دارایی ٢٠٠٣ | ساڵی دەستنیشان نەکراو | کۆی خەرجی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| چاکسازی ئابووری | , ١٣٤, ٤٢٥ $٦ | , ٤٩١, ٨٥٥ $١٨ | - | , ٢٨٠ $٦٢٦,٢٤ |
| چاکسازی پەروەردەیی | ,٠٠٠,٠٠٠ $٦ | , ٩٠٠ ,٠٠٠ $٢١ | - | $٢٥ , ٩٠٠ ,٠٠٠ |
| چاکسازی سیاسی | ١٠, ٥٠٠ ,٠٠٠ $ | ٦١٥, ٠٠٠ $,٢٢ | - | $٣٣, ١١٥, ٠٠٠ |
| پاڵپشتی کردنی ئافرەتان | ٠٣٦ , ٠٠٠ $٦, | ٥٠٠ ,٠٠٠ $٥, ١٩ | ٠٠٠ $١, ,٥٠٠ | $١٣, ٠٣٦ ,٠٠٠ |
| کۆمەکییە بچوکەکانی MEPI | - | | ٠٠٠ $١, ٧٠٠, | $١, ٧٠٠, ٠٠٠ |
| کۆی خەرجی لە | ٦٧٠, ٤٢٥ $,٢٦ | ٥٠٦, ٨٥٥ $,٦٨ | ٠٠٠ $٣, ,٢٠٠ | ٣٧٧ , ٢٨٠ $٩٨, |



**ڕێژەی سەدی خەرجییەکانی MEPI بە پێی ئەو کەرتانەی سوودیان لێ بینیوە**

| کەرت | ساڵی دارایی ٢٠٠٢ | ساڵی دارایی ٢٠٠٣ | تێکڕا |
| --- | --- | --- | --- |
| کۆمەڵگەی مەدەنی عەرەب | ٪٢٥,٨ | ٪١٤,٣ | ٪١٧,٥ |
| حکومەتە عەرەبییەکان | ٪٥٦,٨ | ٪٧٦,٢ | ٪٧٠,٨ |
| کەرتی تایبەتی عەرەبی | ٪٩,٣ | ٪٣,٧ | ٪٥,٢ |
| پرۆگرامەکانی ئاڵوگۆڕ | ٪٨,٢ | ٪٥,١ | ٪٥,٩ |

لە ڕاستیدا، بەرنامەکانی هاوبەشێتی MEPI کەمتر بایەخیان بە گۆڕانکاری دیموکراسی داوە لە بەهێزکردنی توانا و ئەدای حکومەتە عەرەبییەکان و بوارە ئابوورییەکان و قوتابخانەکان ، تەنانەت ئەگەر بایەخێکیش بە مەسەلە سیاسییەکان بدات ئەوا بە هەمان نەهجی خۆپارێزی پێشووی ئەمەریکاوە مامەڵە لەگەڵ ریفۆرم و چاکسازی دەکات و وازی لێ نەهێناوە.

بڕێکی زۆی ئەو پارەیەی لە ریفۆرمیی سیاسی خەرجکراوە لە خزمەتی پێشخستنی ئەدای حکومەتە عەرەبییەکاندا بووە،

بەمجۆرە  بەرنامەی ریفۆرمی سیاسی MEPI بە بڕی ٦٠٠٠٠٠$ خولی راهێنانی بۆ پەرلەمانتارە مەغریبییە تازە هەڵبژێردراوەکان کردۆتەوە لە پێناو (کاراکردنی رۆڵ و بەرپرسیارێتی پەرلەمان لە پرۆسەی یاسادانانادا) کە لەناو بەرپرسیارێتییەکانی پەرلەماندا، بەرچاوترینیان بریتییە لە هاوبەشێتیکردنی دەسەڵاتی یاسادان لەگەڵ (پادشا)دا.

هەروەها بە بڕی ٣٢٥٠٠٠$ یارمەتی پێشکەشکردووە بۆ هاندانی تۆمارکردن و ناونووسکردنێکی کاریگەرتری دەنگی دەنگدەران لە هەڵبژاردنەکاندا و پێشخستنی تواناکانی دەستەی باڵای هەڵبژاردن) تاوەکو لە هەڵبژاردنەکانی ئاییندەدا بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاروچالاکی خۆی ئەنجام بدات.

لەگەڵ ئەوەشدا (دەستەی باڵای هەڵبژاردن) ناتوانێت ئەو راستییە بگۆڕێت کەوا سەرۆکی یەمەنی دەستووری یەمەنی بە جۆرێك هەموارکردووە کە ماوەی سەرۆکایەتی خۆی درێژ بکاتەوە و هەروەها (دەستەیەکی راوێژکاری) تەعینکراوی هەڵنەبژێردراوی بە دامەزراندن دامەزراندووە کەشان بەشان و لەبری پەرلەمان هەڵبژێردراوە پەراوێز خراو و لاوازەکەی خۆی، کارو چالاکی بنوێنێت.

هەروەها بەرنامەی MEPI قازییە عەرەبەکانی کۆکردووە- ئەوانەی دادگاکانیان بەدەست فساد و دەستێوەردانی حکومەتەوە دەناڵێنن- بۆ گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلەکانی سەربەخۆیی



ئیجرائاتی دادگایی،ڕەوشتناسی ، دامەزراندن، راهێنان، ئەمەش بە بڕی ١٤٢٥٠٠٠$.

زۆر لە پرۆگرامەکانی سێ ستوونەکەی تری بەرنامەی MEPI چاکسازی ئابووری، چاکسازی پەروەردەیی، بەهێزکردنی پایەی ئافرەت، پرۆژەی گەشەسەندنی گونجاو و لەبارن  و زۆریان بەبێگومان دەبنە مایەی باشتربوونی ژیانی ژن و پیاو و منداڵانی عەرەب.

**کۆمەکییەکانی بواری ئابووری کە ئەم پرۆژانە دەگرێتەوە:**

- وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامانەی جەزائیر پێشکەشی رێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی دەکات، ٩٦٣٠٠$ .
- پێکەوە بەستنی کۆمپانیا تونسی و ئەمەریکییەکان بۆ سەرمایەگوزاری هاوبەش ١٥٠٠٠$.
- راهێنانی دەست پێشخەران ٧٨٦,٥٧٥ $.
- هاندانی بازرگانی ناوچەیی ( ٦٠٠٠٠$).

**پرۆگرامەکانی بواری پەروەردە کە ئەم شتانە دەگرێتەوە:**

- کتێبی ئینگلیزی A-BOX بۆ مامۆستایانی ئوردنی و مەغریبی ٤٠٠٠٠٠$.
- بەستنی ئەنتەرنێت بۆ قوتابخانە باڵاکانی یەمەن ١٥٠٠٠٠٠$.
- پرۆگرامی ناوەندی پەروەردەی منداڵ بۆ باکووری ئەفریقیا و

کەنداو ۱۰۱$ ملیۆن دۆلار. راستە هەموو ئەمانە بە پرۆژەی باشی گەشەپێدانن بەڵام بۆ بەدیهێنانی گۆڕانکاری سیاسی هیچ ئاسۆیەکی سەرکەوتنیان لە بەردەمدا نییە.

نەهجی پەرشوبڵاوی بەرنامەی MEPI و نەبوونێکی چاوەڕێکراوی خواستی هاندانی چاکسازی سیاسی، ئەنجامی راستەوخۆی سیاسەتی خۆدوورخستنەوە بوون لە

" گرفتی جەزائیر" یا لە "بەرژەوەندییە کێبەرکێکەرەکان".
بەرنامەی MEPI لە پراکتیکدا ئەو ستراتیژەی قبوڵ کرد کە لەلایەن رژێمە عەرەبەکانەوە بە باش زانرابوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشە ناوخۆییە ئاڵۆزبووەکانی خۆیان:ئەویش لیبرالیزمی کۆنترۆڵکراوە.

زۆربەی (۲۲) دەوڵەتی عەرەبییەکە خۆیان، دان بە شکستی سیستماتیکی خۆیاندا دەنێن و بە دوای چاکسازی وادادەگەڕێن کە ئەدای حکومەت و ئابوورییەکانیان چاك بکەن بەبێ گۆڕینی دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی.

لەکاتێکدا ژمارەیەکی کەم لەو رژێمانەی دوورتر بۆ پاشەرۆژ دەڕوانن، هەندێك دەسەڵاتیان داوەتە دەست خەڵك لە رێگەی چاکسازی دەستووری یا هەڵبژاردنەوە، کەچی بەشێکی زۆرتری ئەو وڵاتانە تەنیا گۆڕینی رواڵەتی ئەنجام دەدەن،ئەمەش تەنیا بۆ دروستکردنی ئینتیباعێك سەبارەت بەوەی کەوا جووڵانەوەیەك



بەرەو گۆڕین و ریفۆرم هەیە، ئەمەش لە پێناوی کەمکردنەوەی مەترسی وفشاری رای گشتی کە داوای گۆڕین دەکەن لەسەرەوەڕا.

لەرێگەی پاڵپشتیکردنی ئەم نەهجە ترسنۆك و پڕ لە خۆپارێزیە، ئەمەریکا ئومێدی وایە لەلایەکەوە لە سەرکەوتنی ئیسلامییەکان دووربکەوێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە خۆی لەتێکچوونی پێوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتە عەرەبییەکان دووربخاتەوە، ئەمەش لە رێگەی یارمەتیدانی ئیدارەی رژێمە قائیمەکانی وڵاتانی عەرەب تەنانەت ئەگەر سنووریش بۆ بەشدارێتی سیاسی دابنێن.

نەهجی شێوە کافتریایی بەرنامەی MEPI کە هەموو جۆرەکانی ریفۆرم وەکو یەك هەڵدەسەنگێنێ، رێگە بە حکومەتە عەرەبییەکان دەدات کە پێشنیاری وا بۆ پرۆژە و بواری خەرجکردنی کۆمەکییەکانی ئەمەریکا پێشکەش بکەن کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیان بگونجێت وەك: کۆمەکیکردنی وەرگێڕانی( لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی) ئەو بەڵگەنامە و دیکۆمێنتانەی کە جەزائیر پێشکەشی رێکخراوی بازرگانی جیهانی دەکات. حکومەتی ئەمەریکا بە ئومێدی ئەوەی ئەم جۆرە هەلانە دەقۆزێتەوە کە گوایە وەك ئەسپی تەروادە کاریگەریان هەبێت و چەند درزێکی شەفافیەت لە دیواری چەقبەستووی بیروکراتیەتی عەرەبی بکاتەوە.

بەڵام لە پراکتیکدا، ئەم پرۆگرامانە کارایی رژێمەکان پتەوتر دەکەن و لە دوا ئاکامدا ئەگەریش بۆ ماوەیەکی کاتی بێت، دەبێتە

مایەی دامرکانەوەی ئەو تەنگژە بنەڕەتییەی ئەو وڵاتانە پێیدا تێدەپەڕن کە ئەویش تەنگژەی شەرعییەتە.

لە رووی مەبدەئیەوە، وا مەزەندە دەکرا کەوا بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI خۆی لەم تەڵە دوور دەخاتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی دۆزینەوەی سیاسەتمەدارە لیبراڵە تازە سەرهەڵدراوەکانی ناو کۆمەڵگەی مەدەنی، و کۆمەکیکردنیان و راهێنانیان بۆ ئەوەی نەشونما بکەن و ببنە بنەمای شۆڕشێك،بەڵام لە واقیعدا بەشێکی زۆر کەمی کۆمەکییەکانی بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI بەو ئاراستەیەدا پێشکەش کران.

جەختکردنەوەی بەرنامەی هاوبەشێتی (MEPI) لەسەر پێشکەشکردنی یارمەتی تەکنیکی بە حکومەتەکان، هەندێك لە چالاکە عەرەبەکانی خستۆتە ئەو گومانەوە کەوا سەرلەبەری پرۆژەکە فێڵێکی دیکەی ئەمەریکایە بۆ بەهێزکردنەوەی دەسەڵاتە ئۆتۆکراتە لەرزۆکە هاوپەیمانەکانی خۆی، کە ئەمەش وای لە لیبراله عەرەبەکان کردووە کەوا خۆیان لەو کێشە و گرفتانە بە دوور بگرن کە بێگومانن لەوەی لە حاڵەتی قبوڵکردنی کۆمەکییەکانی بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI دووچاری دێن.

لەوانەیە، یەکێك لە ناخۆشترین ئەو راستییانەی لەم شێوازەی خەرجکردنەی بەرنامەی هاوبەشێتی سەردەردێنن، بریتی بێت لە زیادبوونی ڕێژەی کۆمەکی (لە حکومەت بۆ حکومەتەوە) لە ساڵی دووەمی بەرنامەکە. ئەم مەیلەی خۆ دوورخستنەوەی هەرچی



زیاتری بەرنامەکە لە ئامانجی سەرەکی خۆی کە کۆمەڵگەی مەدەنی عەرەبە، دوو شتی لێ دەکەوێتەوە: یەکەم، یارمەتییەکانی ئەمەریکا دەبنە مایەی بەهێزکردنی ئەو رژێمە عەرەبییانەی قبووڵی بەرنامەکە دەکەن، دووەمیش دەبێتە مایەی زیاتربوونی جەختکردنەوە لەسەر هاندانی گەشەپێدانی ئابووری _لە ڕێگەی بازرگانیی ئازادەوە _لەسەر حسابی چاکسازی سیاسی.

بەڵام وێڕای ئەوەی "بەرنامەی هاوبەشێتی" رووەکانی خەرجی و کۆمەکی خۆی لە ئامانجە بنەڕەتییەکانیشی نزیکتر بکاتەوە، ستراتیژی لەسەرخۆیی و بەرە بەرەیی، مەترسی جێگیر بۆ ئەمەریکا لە خۆیدا هەڵدەگرێت. چونکە لە روانگەی زۆر لەو وڵاتە عەرەبییانەوە کە ئێستا بەرنامەی لیبرالیزەکردنیان قبوول کردووە، بۆ ئەوەیان نەبووە کە بەرنامەکە ئامانجە راستەقینەکانی خۆی بپێکێ و ببێتەهۆی کێبەرکێیەکی سیاسی راستەقینە، بەڵکو بۆ چەواشەکردنی خەڵك و دروستکردنی هەستێك بە بوونی پێشکەوتن لای خەڵك قبووڵیان کردووە، کە ببێتە هۆی دابەزاندنی ئاستی داخوازییەکانی خەڵك لە پێناو گۆڕانکاری سیاسی بەرفراوانتردا.

کەچی قبووڵکردنی ئەمەریکا بۆ ستراتیژیەتی بەرەبەرەیی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا بە تێپەڕینی زەمەن لیبرالیزەکردن تەوژمێکی وا وەردەگرێت کەوا رژێمە عەرەبییە ئۆتۆکراتەکان چیدی نەتوانن بەرگەی بگرن و ناچار دەبن بە نامەرکەزیکردنی

دەسەڵات، بەڵام ئەمە تەنیا پێشبینییەکی دڵنیاکەرەوە نییە, ئەگەر رژێمەکان کۆنترۆڵیان لەدەست دا لەوانەیە ئەنجامەکە ئاڵۆزتر بێت و هیچ گەرەنتیەك نییە کەوا لیبراڵە سەرکوتکراوەکانی ناوچە ببەنەوە.

بەڵام مەترسی گەورەی (ستراتیژی بەرەبەرەیی) لە ئەگەری روودانی گۆڕانکاری دراماتیکی و کتوپڕدا نییە، بەڵکو لە غیابی گۆڕانکاریدایە، بۆ نموونە لیبرالیزەکردنی کەم و سەرەتایی رژێمەکان، بایی ئەوەندە بڕ ناکات کە رێگە بە دروستبوونی رێکخراوی سیاسی وا بدات کە ببێتە ئەلتەرناتیڤی دەوڵەت خۆی، یاخود ببێتە بەدیلی بزاڤە بەرهەڵستکارە ئیسلامییەکان.

ئیسلامییەکان بۆ رێکخستنی سیاسی، مزگەوتیان لەبەردەستدایە، لەکاتێکدا مەحفەلەکانی دیکەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی هێشتا زۆر بە توندی سنووردار کراون.

بەم شێوەیە، رژێمەکان دەسەڵاتی خۆیان دەپارێزن و لە هەمان کاتدا ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی وەکو تاکە ئەلتەرناتیڤی خۆیان دەهێڵنەوە.

زاڵیی ئیسلامییەکان بەسەر ئۆپۆزسیوندا، هەنجەتێکی بەهێزە کە زۆربەی رژێمەکان بۆ ئەمەریکای دەهێننەوە سەبارەت بەوەی کە بۆچی رێگەدان بە ئازادی سیاسی راستەقینە دەبێتە مایەی مەترسی سەرکەوتنی ئیسلامییەکان، هەر لەم روانگەشەوە ئەوە بە



ئەمەریکا رادەگەیەنن کە بۆچی پێویستە ریفۆرمی سیاسی لە فلان و فیسارە سنوور رەت نەکات و پتر نەبێت.

تا ئەو کاتەش کە (نموونەی جەزائیر) لە مێشکی سیاسەتمەندارانی ئەمەریکادا ئەو تارماییە بێت کە دەبێت بە هەموو نرخێك خۆمان لێی دوور بخەینەوە، ئەوا سیاسەتی ئێمەش زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ستراتیژە خۆپەرستانەیەی رژێمەکانی عەرەب کە بریتییە لە گونجاندنی ریفۆرمەکان لەگەڵ بەرژەوەندی و خواستەکانی خۆیان.

لەهەمووشی خراپتر ئەوەیە کە لەوانەیە مەترسی ئەمریکا لە دووبارەبوونەوەی نموونەی جەزائیر پێشبینییەکی راست بێت. ئەمەش لەبەر ئەوەی چەندە حکومەتی ئەمەریکا پاداشتی ئەو رژێمە عەرەبانە بکات کە لیبرالیزە دەکەن، بێ ئەوەی رێگە بە گەشەسەندنی هێزی سیاسی نوێ بدەن، ئیسلامییەکانیش ئەوەندە زۆرتر سوود لەم سیاسەتە سنووردارە وەردەگرن .هەرچەندیش ئیسلامییە چەقبەستووەکان پتر وەکو ئەلتەرناتیڤ ببنە ئەمری واقیع، ئەوەندە خیتابی ئیسلامی سیاسیش دەبێتە خیتابی نارەزایی جەماوەری و دەنگەکانی تریش پەراوێز و فەرامۆش دەکرێن.

هەروەك یەکێك لە بەرپرسە ئیدارییە چاوکراوەکانی عەرەب بەم نزیکانە پێی گوتم: ئەمڕۆ تاکە دەزگایەك لە وڵاتانی عەرەبدا کە تەعبیر لە ئازادی بکات و رەخنە لە حکومەت بگرێت، مزگەوتە، هەر

ئەمەش وای کردووە کە شەعبیەتێکی باشیان هەبێت. کەوایە لە دوا ئەنجامدا (لیبرالیزە کردنی کۆنترۆڵکراو) نابێتە هۆی وشککردنی زۆنگاوەکانی توندڕەوی، بەڵکو دەبێتە مایەی تەشەنەسەندنی. لە کۆتاییدا هەروەك لیبراڵە عەرەبەکان باش دەیزانن، گۆڕانکاری سیاسی بەدی نایەت تاوەکو دەوڵەتە عەرەبییەکان خۆیان پێی هەڵسن. گرنگ نییە حکومەتی ئەمەریکا چەند کۆمەکی دارایی پچڕ پچڕ پێشکەش دەکات بۆ پتەوکردنی کارایی پەرلەمان، یاخود سەربەخۆیی دادگا، یا سەروەری یاسا، چونکە تەشریع و دادوەری لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی وەکو پاشکۆی دەسەڵاتی تەنفیزی دەمێننەوە تاوەکو دەسەڵاتی تەنفیزی بتوانێت یاسای تەواری و ئەحکامی عورفی دەربکات و جڵەوی هێزە ئەمنییەکانی وڵات بەدەستەوە بگرێت. گرنگ نییە چەند پارە لەلایەن (باربووی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NET)ەوە بۆ ڕاهێنانی ئافرەتە پاڵێوراوەکان یا سیاسەتمەدارە لیبراڵەکان خەرج دەکرێت، چونکە ئەوان ناتوانن لە بازاڕی کێبەرکێی سیاسیدا سەرکەوتن بەدەست بێنن تاوەکو دەسەڵاتی ئازادیی بیروڕا و ڕێکخستن هەر لە دەستی حکومەتەکانیاندا بمێنێتەوە.

بۆشایی نێوان ئەو یارمەتییە قەوارە بچووکە تەکنیکیانەی MEPI بۆپێکهێنانی داوودەزگاکان دەیکات وئەو فشارە سیاسییەی کە پێویستە بۆ بەدیهێنانی دابەشکردن و نامەرکەزییەتێکی ڕاستەقینەی دەسەڵات لەلایەن ڕژێمە ئۆتۆکراتەکانەوە، بۆشاییەکی زۆر فراوانە.



کەوایە بەم پێکهاتەی ئێستای، بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI ناتوانێت وەك بەشێکی ناوەندی لە سیاسەتێك خزمەت بکات کە بۆ پاراستنی درێژخایەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا داڕێژراوە یاخود بۆ ڕاکێشانێکی بەهێزی ناوچەیەکی فرە ئالۆزی وەك ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ناو تەونی کۆمەڵگەی هاوچەرخی دیموکراسی دانراوە.

ئەمەریکا تەنیا لە ڕێگەی فشارخستنە سەر ڕژێمەکان و پێشخستنی هەماهەنگی و هاوبەشێتی لەگەڵ ریفۆرمیستە خۆماڵییەکان لەناوەوە و دەرەوەی حکومەتدا

دەتوانێت دەسەڵاتی ئۆتۆکراتە عەرەبەکان سنووردار بکات و یارمەتی بدات لە دروستبوونی فەزایەکی وا کە ئەلتەرناتیڤە لیبرالەکان تێیدا نەشونوما بکەن.

بۆئەوەی ئەمەریکا لە ئەرکەکەیدا سەرکەوێت، پێویستە یارمەتی و هاوکارییەکەی لەگەڵ پێداویستییەکانی چالاکە عەرەبە فیلعییەکان، ببەستێتەوە.

## بەرتەسککردنەوەی بۆشایی متمانە

لەیەك گۆشە نیگاوە ڕەخنەکانی سەرکردەکانی عەرەب سەبارەت بە ئیمپریالی بوونی نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە ڕاستن، بەوەی سیاسەتە دیموکراسییەکان نابێ لە دەرەوەڕا بسەپێنرێت

بەڵکو پێویستە لەناوەوەڕا گەشە بکەن و جێی قبووڵی پێشەوا سیاسییەکان (ئەوانەی لە دەسەڵاتدا نین) و هاووڵاتییە ئاساییەکان بن گرفتەکەش لێرەدایە، زۆر لە چاکسازە عەرەبەکان باوەڕ بە بەڵێنەکانی ئیدارەی بوش ناهێنن سەبارەت بە پاشگەز بوونەوەی لە پاڵپشتی دەیان ساڵەی بۆ دیکتاتۆرە عەرەبەکان.

بەبێ سەلماندنی جددیەتی ئیلتزام بوونمان بەو بەڵێنەمان کەوا وەکو هێزێکی پاڵپشتیکەری گۆڕان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕۆڵ دەنوێنین، ناتوانین متمانەی ئەو کەسانە بەدەست بێنین کە پێمان وایە پاشەڕۆژی عەرەبیان دەکەوێتە دەست: واتە چالاکە لیبراڵە تازە نەفەسەکانی ناوچەکە.

لەم گۆشە نیگایەوە دەتوانین باس لە بزاڤێکی لیبراڵی سەرەتایی لە جیهانی عەرەب بکەین، بەڵام بزاڤێکی لەو چەشنە لە ئارادا نییە.

هەندێك لە چالاکە لیبرالە عەرەبەکان پارێزەرن، یا پرۆفیسۆرن یا ڕۆژنامەنووسن بەرەنگاری هەلومەرجی سیاسی دیفاکتۆ دەبنەوە,لەر یگەی داواکردنی جێبەجێکردنی

ئەو حوکمە سیاسییانەوە کەلە دەستوورەکانی قۆناغی دوای کۆلۆنیالیزم هاتوون، هەندێکی تریان ئەو پەرلەمانتارانەن کە داوای چاودێری دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەن. هەندێکی تریشیان ئەو کابینە وەزارییانەن کە بەرەنگاری سەرکردە خێڵەکییەکان و کەسایەتییە بەهێزەکانی نوخبەی فەرمانڕەوا دەبنەوە، بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا تەحەدییەکانی پاشەڕۆژ، گۆڕانکاری گرنگ



دەخوازن. لە هەندێك وڵاتدا لیبرالەکان کۆنترۆڵی جڵەوی حکومەت دەکەن لە هەندێك وڵاتی تریشدا لەناو زینداندان، بەڵام لە هەموو شوێنێکدا بەشێوەیەکی بەرچاوتر دەنگیان دەبیسترێت و دەبینرێن، نەك تەنیا لە ئاستی ناوخۆدا بەڵکو لە ئاستە هەرێمایەتییەکان و جیهانییەکانیشدا ، سەرەڕای ئەو هەستی بەختەوەرییەی لای لیبراڵە عەرەبەکان سەری هەڵداوە لە ئەنجامی

دانپێدانانی سەرۆك بوش بە هەڵەی مێژویی ئەمەریکادا نا سەبارەت بە "پۆزش هێنانەوە بەرامبەر بوونە هۆی نەبوونی ئازادی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا"، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەو لیبرالانە هێشتا بە گومانن چ لەبارەی ڕاستیی ئامانجەکانی ئەمەریکا

یا لە بارەی پابەندبوونی ئەمەریکا بەو ئامانجەی خۆی کە سەرۆك بوش لە (٢٥) ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ لە وتارەکەی لەبارەی حاڵەتی یەکێتییەوە بەچەند وشەیەك دەری بڕی: "ئاشتییەکی دیموکراسییانە.. ئاشتییەك کەلەسەر بنەمای بەها و مافەکانی هەموو پیاوێك و هەموو ژنێك وەستابێت".

بۆ زاڵبوون بەسەر دوو دڵی و گومانەکانی لیبراڵەکان، هەروەها بۆ ئەوەی ئەمەریکاو بتوانێ کاریگەریی بەسەر مەسەلە سیاسییەکانی وڵاتە عەرەبییەکانەوە هەبێت، پێویستی بە ستراتیژێکی وا هەیە کە بتوانێت بەرەنگاری کێشەی (نموونەی جەزائیر) ببێتەوە، هەروەها چارەسەری مەسەلەی بەرژەوەندییە

کێبەرکێکارەکان بکات، بە تێکەڵکێشی کردنێکی تەواوی هاندانی دیموکراسی لەگەڵ دیپلۆماسییەتی هەرێمایەتی ئەمەریکا.

سیاسەتێکی لەم چەشنە پێویستە ئەرك و هەوڵە قەوارە بچووکەکانی وەك پرۆگرامەکانی ئێستای بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI بە دیپلۆماسییەتی (بەخۆشیت بێت یا بە ترشی-ترغیب و ترهیب) ببەستێتەوە تاوەکو هانی رژێمە عەرەبییەکان بدات، هەواوکەشی ئازاد لەبەردەم گفتوگۆ و کێبەرکێی بیروبۆچوونەکان بکەنەوە، هەروەها هەوڵێکی هەماهەنگی وا لە خۆ بگرێت کە رێگەی بەشداری سیاسی لەگەڵ دیموکراتە عەرەبەکان چ لە ناو خۆیان یا دەرەوەی حکومەتەکان بکات، هەروەها یارمەتییە دەرەکییەکانمان لەگەڵ خواست و داواکارییە ناوخۆییەکانی لیبراڵ و دیموکراتەکان جووت بکەین و یەك خەین. پێویستە ویلایەتەیەکگرتووەکان فشار بخاتە سەر رژێمە عەرەبەکان تاوەکو سیاسەتەکانیان چاك بکەن نەك تەنیا پرۆسە سیاسییەکانیان، پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی بەردەوام ئەم پەیامە لە ناوچەکەدا بلاّو بکاتەوە: لیبرالیزەکردنی کۆنترۆڵکراو کە دەبێتە مایەی دروستبوونی چەند دەزگایەکی نیمچە دیموکراتی بێ دەسەلاّت، دیموکراتیزەکردن نییە. بێگومان هەڵبژاردنەکان گرنگن، بەلاّم وەك نموونەی جەزائیر فێری کردین پێویستییەکی سەرەکی نییە، بەڵکو لەمە گرنگتر ئەو زەمانەتانەن کە وا دەکەن هاوولاّتی و گرووپە جۆراوجۆرەکان بتوانن بە ئازادی قسە بکەن یا رێکخستن بکەن یا بەشێوەیەکی کاریگەر چالاکی سیاسی بنوێنن:



واتە ئازادی چاپ و بلاّوکردنەوە، ئازادی رێکخستن، ئازادی کۆڕ و کۆبوونەوەی ئاشتییانە، شەرعییەتدان بە پارتە سیاسییەکان و گرووپەکانی فشارە، لەکاتێکدا هەندێك یا هیچ کامێك لەم مافانە لە زۆربەی ولاّتانی عەرەب لە ئارادا نین.

ناچارکردنی حکومەتەکان بە دەست کێشانەوەی کۆنترۆڵیان بەسەر ژیانی گشتی خەڵکەوە و پێدانی دەسەلاّت بەو دەزگایانەی دەیانەوێت بەشداری بکەن، زۆر پێویستە ئەگەر هێزە سیاسییە نائیسلامییەکان لە کاردابن بۆ رێکخستن و فۆرمۆڵەکردنی ئەجێنداکانیان و گەلاّڵەکردنی بەرنامەکەیان بەرامبەر بە حکومەت بە کێبەرکێکردن لەگەڵ ئیسلامییەکاندا. لەکوێتدا کاتێك ئەمیرەکەی بەهاندانی ئەمەریکا لە دوای داگیرکردنی عێراق-کۆنترۆڵی خۆی سست کردەوە، دەیەیەك لەئازادی رادەربڕین، نەمانی دادگا ئەمنییەکانی حکومەت، هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی چاودێر بەسەر دەسەلاّتی جێبەجێکردنەوە، دەستی پێکرد و بووەمایەی نەشونماکردنی بزاڤێکی سیاسی لێبراڵی خاوەن نوێنەر لە پەرلەماندا کە ئەلتەرناتیڤی راستەقینەی ئیسلامییەکان و پادشایەتین لە هەمانکاتدا.

هەرچەندە ئیسلامییەکان هێشتا ئۆپۆزسیۆنی سەرەکین بەلاّم لیبراڵەکان کێبەرکێکاری زیندووی ئەوانن لە مەحفەلە سیاسییەکاندا.

له هەمووی گرنگتر، لیبراڵەکان له کوێت لە هەندێك بۆنەدا دەبنە هاوپەیمانی ئیسلامییەکان بۆ بەدەستهێنانی ماڤ پەرلەمان لە چاودێریکردنی حکومەت، لەکاتێکدا لەهەندێك حاڵەتی تردا لەگەڵ توێژە لیبراڵەکانی ناو بنەماڵەی پادشایی هاوپەیمانی دەکەن بۆ بەرەورووبوونەوەی نەخشە و پرۆژەی ئیسلامییەکان.

ئەم هاوپەیمانێتییە سیاسییە سەرەتاییانە یەکەمین بەڵگەی ئەوەن کە دەکرێت فرەحزبێتیەکی سیاسی دروست لە کۆمەڵگەی عەرەبی چەکەرە بکات و ئەمەش رێگە لەوە دەگرێت کەوا لیبرالیزەکردن ببێتە مایەی (یەك کەس، یەك دەنگ، یەکجار). لەگەڵ بوونی ئەم رەگەزە پێکهێنانەی دیموکراسی، وا پێدەچێت کە ئەوانەی لە کوێت پشتگیری لەماڤ دەنگدانی ئافرەت دەکەن سەرکەوتن بەدەست بێنن.

بەڵام لەو وڵاتانەدا کە ئازادی رادەربڕین تا رادەیەکی زۆر توند سنووردار کراوە، گرووپە کۆمەڵایەتییە نا ئیسلامییەکان ماوەیەکی زۆریان ماوە بڕن تا وەکو بتوانن لەشەقامی بیروبۆچونەکاندا بەرەوڕووی ببنەوە و کەمتریش دەتوانن لە مەحفەلە سیاسییەکاندا جێ پێیەك بۆ خۆیان بکەنەوە.

بۆ نموونە لە عەرەبستانی سعودیەدا گرووپێکی بەرچاوی رۆشنبیران هەن کە ریفۆرمیستی لیبراڵن، بەڵام لەبەر ئەوەی رێگە بە دامەزراندنی پارتی سیاسی نەدراوە و ماڤ کۆڕ و کۆبوونەوەی سیاسی قەدەغەکراوە و راگەیاندنیش کۆنترۆڵ کراوە، ئەوا هیچ



رێگەیەکی خۆ رێکخستن شك نابەن، هەروەها هیچ رێگەیەکیان لەبەردەمدا نییە کە لەناو کۆمەڵگەدا پشتیوانی بۆخۆیان بەدەست بێنن، جگە لەوەش هیچ میکانیزمێکیان نییە کە فشار بخەنەسەر حکومەت جگە لە چەند نامەیەکی کراوە بۆ شازادە نەبێت.

هەروەها شایەنی باسە هەیکەلییەتی ئیستیبدادی سعودییە وەك رژێمە هاوشێوەکانی تر، بوارێکی زۆر کەم بە ئازادی رادەربڕین دەدات، لەم بەهارەدا هەندێك لە کەسایەتی لیبراڵی دیار کە لەبارەی بۆچوونەکانیان گفتوگۆیان لەگەڵ شازادە دا کردبوو، بە بیانووی پلاندانان بۆ دامەزراندنی گرووپێکی چاودێری ماڤ مرۆڤی سەربەخۆوە، زیندانی کران.

بۆ ئەوەی ئەمەریکا بتوانێت متمانەی خۆی لای دیموکراتە عەرەبەکان بگێڕێتەوە، پێویستە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا وا لە حکومەتە عەرەبییەکان بگەیەنێت کە ئەو وڵاتانەی رێگە بە ئازادی دەربڕین و رێکخستن و چانس بە دابەشکردن و هاوبەشێتی کردنی دەسەڵات دەدەن، ئەوا لە پێوەندی باشتر لەگەڵ ئەمەریکا بەهرەمەند

دەبن لەچاو ئەو وڵاتانەی تەنیا بە قسە باس لە ریفۆرم دەکەن، بەڵام لە جێبەجێکردنی سەرناکەون .

کەوایە ئەمەریکا خاڵی فشاری بەهێزی پێیە، بەڵام تاوەکو ئێستا وای پێ خۆشە کەوا ئەو خاڵانە بەبێ رەچاوکردنی پێشکەوتنی دیموکراسی بە کار بێنێت.

پێشنیاری سەرۆك بۆش لەبارەی (ناوچەی بازرگانی ئازادی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست)ەوە، بەشێوەیەمکی سەرەکی بۆ ئەوە داڕێژرابوو کە ئابووری وڵاتە عەرەبییەکان تێکەڵ بە بازاڕی جیهانیی بکات و سامانێکی وا پێك بێت بەو ئومێدەی ئازادبوونی ئابووری بە تێپەڕینی کات ببێتە مایەی هاندانی دیموکراسی.

لە کاتێکدا ئەو راستییە هەیە کەوا لە زۆر ناوچەی تردا، پەرەسەندنی بازرگانیی دەرەکی و سەرمایەگوزاری بیانی بووەتە مایەی هاندانی گۆڕانکاری دیموکراسی ناوخۆیی، بەڵام پێکەوە گونجانی ئابووری کراوە و سیاسەتی داخراو لە (چین)دا، لەلای فەرمانڕەوایانی عەرەب وەك نموونەیەك و مۆدێلێکی سەرکەوتوو تەماشا دەکرێت، بۆ ئەمەش پاساوی باشیان بەدەستەوەیە.

پاڵپشتی ئەمەریکا بۆ کۆمەکە داراییەکانی رێکخراوی بازرگانی جیهانی WTO بە وڵاتانی عەرەب، بووە مایەی بەهێزبوونی پێوەندییە ئابورییەکان، بەڵام دەکرێت وتووێژە تازەکانی بازرگانیی ئازاد بە ئاشکرایی مەرجدار بکرێن بە رادەی پێشکەوتنی سیاسییەوە، هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکان لە وتووێژەکانی بازرگانیی ئازاددا دەتوانێت فشاری پتر بخاتە سەر وڵاتە عەرەبییەکان بۆ بەدیهێنانی شەفافییەتێکی زۆرتر و پتەوکردنی سەروەری یاسا، کە ئەمانەش گوڕ و تین دەدەنە ریفۆرمی ناوخۆیی لەو وڵاتانەدا.



ستراتیژیی سەرکەوتووی دیموکراتیزەکردن، بەرەنگاربوونەوەی رژێمە ئۆتۆکراتەکان دەگرێتەوە ، بەڵام نەك تەنیا لەسەرەوەڕا واتە لە رێگەی فشاری دیپلۆماسییەوە، بەڵکو دەبێت لە خوارەوەشڕا واتە لە رێگەی کار و چالاکی کۆمەڵگەی مەدەنیشەوە کاری بۆ بکرێت.

بۆ ئەوەی کێشەی بەیەکداچوونی بەرژەوەندییەکان کەم بکرێتەوە، پێویستە حکومەتی ئەمەریکا زۆر بە وردی حساب بۆ پاڵپشتی خۆی بۆ بەرهەڵستکارە نێوخۆییەکانی وڵاتانی عەرەب بکات.

لە شوێنێکدا حکومەتی ئەمەریکا بەشێوەیەکی نەگۆڕ دژی بەردەوامبوونی رژێمێکی قائیمی دیاریکراو بێت، هیچ هۆیەکی بەهێز نامێنێتەوە بۆ حکومەتی ئەمەریکا کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کۆمەکی دارایی پێشکەش بە دیموکراتە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانە نەکات. وڵاتانی وەك لیبیا و سوریا دەچنە خانەی ئەم جۆرە وڵاتانەوە، هەروەها پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کەوا هەرچەندە ئەمەریکا بە ئاراستەی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ لیبیا هەنگاو دەنێت، بەڵام هیچ کاتێك پشتگیری خۆی بۆ (سەرکردایەتی شۆڕشگێڕانەی) قەزافی ڕانەگەیاندووە.

بەڵام لەباقی وڵاتانی دیکەی عەرەبدا، حکومەتی ئەمەریکا ناتوانێت راستەوخۆ پاڵپشتییەکی بەرنامەداڕێژراو پێشکەش بە

ڕێکخراوەناوخۆییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بکات، چونکە ڕۆڵی ڕێکخراوە ناحکومییە خۆماڵییەکان (NGO) ئەوەیە کە بەرەنگاری حکومەتەکانیان ببنەوە و  فەزایەکی گشتی بۆ گفتوگۆ و بەشداری هاووڵاتییان لە بەڕێوەبردن و بڕیاری سیاسی بگێڕنەوە، کەچی ڕۆڵی بەرپرسانی ئەمەریکا ئەوەیە کەئاستی هەماهەنگی و پێوەندیی وڵاتەکەیان لەگەڵ هەمان ئەو حکومەتە عەرەبییانە بەرەوپێش ببەن، جا کاتێك دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان داوایان لێدەکرێت کە پێشنیار یا کۆمەك پێشکەش بە بەرنامەکانی هاوکاریکردنی ڕێکخراوە ناحکومییەکانی عەرەب بکەن، ئەوا بەدژیەکداچوونی بەرژەوەندییەکان تەنانەت بۆ ئەو کەسانەی زۆر ئامادەیی هاوکاریکردنیشیان تێدایە، زۆر بە زەقی بەدەردەکەوێت، بەمجۆرە دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان دەخرێنە ئەم دەرەنجامە حەتمییەوە کە ئەویش گونجاندنی پرۆگرامەکانی هاندانی دیموکراسییی خۆیانە لەگەڵ خواست و  پێداویستییەکانی ئەو حکومەتە خانەخوێیانەی کاری تێدادەکەن. بەم ڕێگایە خۆشباوەڕی سەبارەت بە پێشکەوتن دروست دەبێت و، بنەمای پرۆگرامەکان تێکوپێك دەدرێن و لە هەمووشی خراپتر، گومانی لایەنگرە خۆماڵییەکانی ریفۆرم سەبارەت بە ڕاددەی هاوسۆزی و پابەند بوونی ئەمەریکا بە بەڵێنەکانی بۆ گۆڕینی دیموکراسی، زیاتر دەکات.

لەوەش زیاتر ئەو ڕۆتینە بیرۆکراتییەی پێویستە بۆ پاساوهێنانەوە و شەرعیەتدان بە پرۆگرامەکانی کۆمەکی پێکردن



لەبەردەم کۆنگرێسدا، زۆر جار وای لەبەرنامەی هاوبەشێتی MEPI کردووە کە پتر جەخت لەسەر پرۆژەی (دۆستانە و ئاشکرا) بکات لەسەر حسابی پرۆژەی ( بێ دەنگتر) بەڵام کاریگەرتر بۆ دروستکردنی توانایەکی ڕێکخراوەیی دوورمەودا بۆ بزاڤی ریفۆرمی عەرەبی. ئەم هەستەمەترسیدارەی لامان دروست بووە سەبارەت بەوەی کەوا ئەوەی ئێمە دەیکەین هەڵەیە، بە روونی لە بەرنامەی (هەڵمەتی قوتابخانەکانی کەنداو) دەرکەوت کە لەلایەن بەرنامەی هاوبەشێتی (MEPI)ەوە خەرجییەکەی کرا، و لەم زستانە لە قەتەر ئەنجامدرا.

بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك لە ئافرەتە چالاکەکان بۆ گفتوگۆکردن لەسەر بەڕێوەبردنی ئۆفیسی سیاسی قەناعەتی نەهێنا، بۆیە هەستا بە تێئاخنینی سیمینارەکە لەگەڵ کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی بۆ پێداهەڵدانی سەرکەوتنی خۆی. بەڵام کاتێك بەشداربووە عەرەبەکان بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکەیان نووسییەوە کە ڕەخنەیەکی نەرمی دژ بە سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر کێشەی ئیسرائیل – فەلەستین تێدا هاتبوو، نوێنەری (بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI) سوور بوو لەسەر گۆڕانێکی دوا دەقیقەیی لە خشتەکەدا بە جەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی ئافرەتان لە کاتی ئامادەکردنی بەیاننامەی کۆتاییدا ئامادە نەبوونە.

لەبری نەخشەڕێژکردن و جێبەجێکردنی راستەوخۆی پرۆرگرامەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وەك (بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI) ئێستا دەیکات، وا پێویست دەکات کە حکومەتی ئەمەریکا کۆمەکییەکی راستەوخۆی زیاتر پێشکەش بەو رێکخراوە ناحکومییانە بکات کە لە میانەی شەڕی ساردا بۆ هاندانی دیموکراسی لە ئەوروپا دای هێنان. لەوانەیە پێشنیاری سەرۆك بوش سەبارەت بە دوو هێندەکردنی کۆمەکییەکەی (باربووی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED) تاکو ئێستا زیرەکترین ڕەگەزی سیاسەتی دیموکراتیزەکردنی ئیدارە بێت (هەرچەندە لەوانەیە هێشتا لە هەمووان دوورتر بێت لە جێبەجێکردنی) بەرنامەی (باربووی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED) و رێکخراوە پێوەندارەکانی (کە زۆر نزیك و پێوەستن بە پارتی دیموکرات و پارتی کۆماری و بزووتنەوەی کاری ئەمەریکا و ژووری بازرگانی ئەمەریکاوە) دەتوانێت بەبێ ئەو تەگەرانەی رۆتینە بیرۆکراتییەکان بەربینگی (بەرنامەی هاوبەشێتی MEPI) دەگرن، بەشێوەیەکی باشتر کار بکات، بەتایبەتیش کە پتر لە دەیەیەك لە ئەزموون و شارەزاییان لە بواری کارکردن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە.

لەکاتێکدا زۆر بەراوردی نابەجێ لەنێوان خەباتی دژ بە کۆمۆنیزم لە ئەوروپای رۆژهەڵات و خەباتی دیموکراسی لە وڵاتانی عەرەب لە ئارادان، بەڵام ئەو کۆمەڵگە ئەمەریکاییانەی هانی دیموکراسی دەدەن زۆر بەباشی جیاوازییەکانی ئەم شوێنە جۆراوجۆرانە تێدەگەن و هەڵدەسەنگێنن و بەپێی ئەوەش ستراتیژییەتەکانی



خۆیان دادەڕێژن. کەوایە لە دوا شیکردنەوەدا، پێویستە ویلایەتەیەکگرتووەکان باوەڕ بەوە بێنێ کەوا بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی لەگەڵ وتووێژکارە عەرەبەکانیدا، کۆتایی بەو ناکۆکی و گرژییە دێنێت کەوا هەوڵێکی جددی لە پێناو دیموکراتیزەکردن کارێکی حەتمییە هەر دەبێ رووبدات. زۆر لەوانەی لە دامەزراوە دیپلۆماتییەکان کاردەکەن، پاساوی ئەوە دێننەوە کە نەهجێکی توندتری دیموکراتیزەکردن بەشێوەیەکی حەتمی لەسەر حسابی هەماهەنگی وڵاتە عەرەبییەکان دەبێت لە مەسەلە و ئامانجە هەرێمایەتییەکانی تردا، بۆیە تێڕوانینێکی فراوانتر پێویستە. پێوەندییەکانی ئەمەریکا لەگەڵ وڵاتە عەرەبییە سەرەکییەکان لەسەر بنچینەی تۆڕێکی درێژخایەنی بەرژەوەندی دوو قۆڵی هاوبەش وەستاوە، ئەمجۆرە پێوەندییانە دەتوانن بەرگری گرژییەکان بکەن، ریاز و واشنتۆن لە بواری بەرگریکردنی ستراتیژی لە کەنداو و راگرتنی جێگری نرخی پترۆڵدا، بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە ، ئەم بەرژەوەندییانە هەروا دەمێننەوە تەنانەت ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان فشارێکی قورستریش بخاتە سەر عەرەبستانی سعودی لە پێناوی ریفۆرمی سیاسی. حکومەتی میسریش بەلای خۆیەوە، بەرژەوەندییەکی بنەڕەتی هەیە لە رێگەگرتن لە هەڵایسانی ئاگری شەڕ لە فەلەستیندا، هەروەها لە پێشەوەچوونی پرۆسەی ئاشتی عەرەب– ئیسرائیلدا، بەبێ رەچاوکردنی ناکۆکییەکانی تری لەگەڵ واشنتۆن. کەوایە ئەمەریکا نابێت لەوە بترسێت کە پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتە

عەرەبییەکان مەرجدار بکات، بەتایبەتی یارمەتییە ئابووری و سەربازییەکانی بە مافەکانی مرۆڤ و ریفۆرمی سیاسییەوە. بۆ نموونە کاتێك لە ساڵی ٢٠٠٢ واشنتۆن هەڕەشەی ئەوەی کرد کەوا کۆمەکی ئیزافی لە میسر دەبڕێت بەهۆی زیندانیکردنی چالاکی دیموکراتخوازی (خاوەن رەگەزنامەی دوانەی میسری-ئەمەریکی) سەعدەدین ئیبراهیمەوە، ئەوە پەیامێکی توند بوو بۆ حکومەتی میسری بەبێ ئەوەی پێوەندییە دوو قۆڵییەکانیان تێك بدات.

هەندێك لە رەخنەگران چ لێرە یا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێیان وایە کەوا فشاری ئاشکرا لەلایەن ویلایەتەیەکگرتووەکانەوە لەوانەیە کاریگەرییەکی پێچەوانەی هەبێت و رژێمە عەرەبییەکان باشتر بەپیر رەخنە ژێر بەژێرەکانەوە دێن لە چەپڵەلێدانی ئاشکرا، بەڵام نابێ ئەو راستییەش لە بیر بکەین کەوا هەڕەشەی ئاشکرای واشنتۆن سەبارەت بە پیرەوە نەهاتنی داخوازییەکانی میسر بۆ یارمەتی، دوای دوو ساڵ لە سەرنەکەوتنی دیپلۆماسییەتی هێمن ونهێنی هات، بۆ ئازادکردنی سەعدەدین ئیبراهیم لە زیندان.

کاتێکیش من بەم نزیکانە پرسیارم لە ریفۆرمیستێکی دیکەی میسری کرد کە ئایا بە باش دەزانێت ویلایەتە یەکگرتووەکان یارمەتییەکانی خۆی بۆ میسر مەرجدار بکات بە ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکانی دیکەی میسرەوە، لە وەڵامدا بە خێرایی گوتی: بێگومان بە ئاشکرا من دژی دەوەستم، بەڵام ژێر بە ژێر پاڵپشتیی لێوە دەکەم.



گرنگترین شت بۆ سەرکەوتنی هەوڵەکانی ئەمەریکا بۆ دیموکراتیزەکردن ئەوەیە تا چەند دەتوانێت کە هەوڵە دەرەکییەکانی خۆی لەگەڵ خواست و داواکارییەکانی ریفۆرمیستەکان لەناو وڵاتانی عەرەبدا بگونجێنێت و پرۆگرامەکانی هاوکارییەکانی خۆی لەگەڵ ئەجێندا دیپلۆماتییەکەی بسازێنێ.

با نموونەیەك بهێنمەوە، ئەو کۆمەکییانەی کە ئێستا لەلایەن (بەرنامەی هاوبەشێتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە MEPI) بۆ (ئینتەرنیون) دەکرێن کە یەکێکە لە رێکخراوە قازانج-نەدارەکان لە بواری راهێنانی رۆژنامەنووسانی سەرتاسەری ناوچەکە ، بە فشارێکی بەردەوام بۆ سەر رژێمەکان نەبەستراونەتەوە تاوەکو کۆنترۆڵیان لەسەر میدیاکان خاو بکەنەوە.

جێی شانازییە کەوا سەرۆك بوش، هەوڵێکی زۆری دا بۆ رازیکردنی سەرۆکی تونس زین عابدین لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ کۆشکی سپی کە رێگە بە ئازادیی راگەیاندن بدات، بەڵام کاتێك لە ساڵی رابردوودا کۆمەڵێك رۆژنامەنووسی سعودی بەهۆی ئەوەی پرسیاریان خستبووە سەر کاریگەری پیاوە ئایینییە توندڕەوەکان بەسەر سیاسەتەوە یاخود بەسەر دوورخستنەوەی ئافرەت لە ژیانی گشتیدا، کاری خۆیان لەدەستدا یاخود ستوونە رۆژنامەوانییەکانیان داخرا، بەڵام لە سەکۆی واشنتۆنەوە هیچ هەوڵێکی جددی لە بەرژەوەندی ئەوان نەدرا.

## ليبرالەكان بە ئاشكرايی قسە دەكەن

جووتكردن و گونجاندنی دەستێوەردانەكانی ئەمەریكا لەگەڵ داخوازییەكانی عەرەبەكان، ئێمە – ئەگەر بۆ ماوەیەكی كورتیش بێت – لە تۆمەتی دەستێوەردانی ئیمپریالییانە دەپارێزێت، هەروەها كاریگەری دەستێوەردانی ئێمەش پتەوتر دەكات و چانسی ئەو لیبراڵە عەرەبانەش بە هێز دەكات كە وەك پاڵێوراو و سەركردەی سیاسی چالاك لە بەرامبەر ئۆتۆكراتەماندووەكان و ئیسلامییە خاوەن جەماوەرەكان و ناسیونالیستە سۆشیالیستە چەپڕەوەكان –كە هێشتا لە هەندێك وڵات هاوسۆزیان هەیە – وەستاون.

كەواتە ئێمە دەبێ بە جددی تێڕوانینەكانی لیبراڵە عەرەبەكان بە هەند هەڵبگرین. لیبراڵە عەرەبەكان، بەتایبەتی دوای رووخانی سەدام، زیاتر حەز بە دەربڕینی بیروڕاكانیان دەكەن، بۆ نموونە بەم نزیكانە واتە لەئاداری ساڵی (٢٠٠٤)دا، كۆنفرانسێك لە شاری ئەسكەندەریەی میسر بەسترا، كە ژمارەیەك لە چالاكەكان لەسەرتاسەری ناوچەكە تێیدا بەشداربوون و بەڵگەنامەیەكیان پەسەند كرد كە پڕاوپڕیەتی لەهیوا و خواستی سەرسوڕهێنەر بۆ ئایندە، كە تێیدا ئامانجی خۆیان بەوە پێناسەكرد كە بریتییە لە بەدیهێنانی "سیستەمێك كە ئازادی سەرەكیترین بەها و نرخی تێدا هەبێت و جەخت لەسەر سەروەری راستەقینەی خەڵك و



حكومەتێكی بەڕێوەبراو لەلایەن خەڵكەوە لە رێگەی فرە حزبییەوە بكات و بە ئاراستەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات هەنگاو بنێت".

(بەڵگەنامەی ئەسكەندەرییە) لە كاتێكدا دانی بە زەروورەتی چارەسەركردنی كێشە ئاڵۆزتربووەكانی ناوچەكە ناوە، ئەوا داوای نەهێشتنی یاساكانی عورف، هەڵوەشاندنەوەی دادگا ئەمنییە تایبەتییەكانیشی كردووە (ئەو دادگایانەی بۆ سزادانی بەرهەڵستكاران  دوور لە چاوی خەڵك و لە دەرەوەی فەرمانڕەوایی یاسا پێك دەهێنرێن)، هەروەها داوای چاكسازیی دەستوورییشی كردووە لە بواری: سنوورداركردنی ماوەی فەرمانڕەوایەتی سەركردەكان، دوورخستنەوەی هەندێك لە دەسەڵاتەكان لە دەسەڵاتی جێبەجێكردن، جەخت كردن لەسەر جێبەجێكردنی یاسا تەنانەت بەسەر سەركردە سیاسییەدەستڕۆیشتووەكانیشدا.

هەر لەسەر نەهجی پاڵپشتیكردنی بانگەوازە ناوخۆییەكانی ریفۆرمەرە عەرەبەكان بەهۆی هێزی دەرەكی خۆمانەوە، ویلایەتە یەكگرتووەكان دەتوانێت لە رێگەی (فەراهەمكردنی بوار بۆ گردكردنەوەیان، گۆڕینەوەی زانیاری لە نێوان خۆیاندا و پێشخستنی ئەجێندای هاوبەش و پێشخستنی بەهرەكانیان لەڕێكخستنی جەماوەر) لە سەرتاسەری ناوچەدا هاوكاریان پێشكەش بكات.

ئەو پرۆژانەی ئەمەریكا كۆمەكی داراییان پێدەكات ( كە وا باشترە كە رێخكراوە ناحكومییەكانی رۆژئاوا NGO پێی هەڵستن)

دەتوانن یارمەتی ریفۆرمەرە عەرەبەکان بدەن تاوەکو لە تۆڕێکدا بەیەکەوەیان ببەستنەوە، هەروەها لەگەڵ هاوکارەکانیان لە جۆرجیا و کۆریای باشوور و سربیا و هەندێ وڵاتی تر بیانبەستنەوە کە شارەزاییەکی باشیان لە گواستنەوە بەرەو دیموکراسیدا هەیە، ئەم پرۆگرامانە پێویستە ئەوان رابهێنێت (بەڵام نەك لەسەر ئەوەی چۆن چاودێری دارایی بخەنە سەر کۆمەکە داراییە بیانییەکان یان بەڕێوەبردنی ئۆفیسەکان!!).

لیبراڵە عەرەبەکان بەوە سەرکەوتن بەدەست ناهێنن کە هەر بە دوای هەڵبژاردنە نیمچەکراوەکانی رێکخراوە نیمچە سەربەخۆیەکاندا ڕا بکەن.

لەبری ئەوە، پێویستە هاوکاری ئەمەریکا لە خزمەتی پێشخستنی بەهرە و توانای رێکخراوەیی و توانای پێوەندیکردن و راگۆڕینەوەی فراوانی ئەوان لەگەڵ خەڵکدا بێت، بۆ ئەوەی ئەگەر هەلێکی وەك (تەزویرکردنی هەڵبژاردنەکان، تەنگژەی دارایی، رەشەکوژییەك، ئاژاوەیەکی ناو گۆڕەپانی تۆپی پێ) هاتە پێشەوە، ئەوا بتوانن سوودی لێوەرگرن و ئەو هەستەی جەماوەر کە لە ئاکامی ڕووداوەکەوە دەوروژێت  بە ئاراستەی گۆڕینی دیموکراسی بجوڵێنن.

ئەمە ئەو جۆرە هاوکارییە بوو کە ئەمەریکا و وڵاتانی تر پێشکەش بە قوتابیانی سربیا و جۆرجیا کرد، ئەمەش بوو نەك (لیبرالیزمی کۆنترۆڵکراو) بووە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشە



دیموکراسییەکان لەسەرتاسەری دنیادا. پێویستە ئێمە چاوەڕێی ئەوە نەکەین کەوا ئێمە لەلایەن لیبراڵە عەرەبەکانەوە وەك رزگارکەر پێشوازیمان لێوە بکرێت، تەنانەت لای ئەوانەش کە ئێمە یارمەتیمان دان کە لە زیندان ئازاد بکرێن وەك سەعدەدەین ئیبراهیم.

لە قۆناغی ئێستای پێوەندییە ئەمەریکی – عەرەبییەکاندا زۆر لە لیبراڵە عەرەبەکان تاوەکو ئێستاش بە لێبڕاوی لەگەڵ سیاسەتی ئەمەریکا لە عێراق و ئیسرائیل و شەڕی دژە تیرۆردا، تەبا نین.

بە ناڕەزاییەوە باس لە زێدەڕۆیی و موبالەغەکردن لە هەڵسەنگاندنی کاریگەری ئەمەریکا بەسەر ناوچەکەیانەوە دەکەن و لەسەر ئەوەش بەردەوام دەبن.بەڵام پێویستە ئێمە لە پاڵپشتیکردنیان بەردەوام بین . یارمەتیدانی لیبراڵە عەرەبەکان تاوەکو لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیان سەرکەون بەبێ ئەوەی ئیددیعای ئەوە بکەین کە بەهاوکاری ئێمە کراوە، هەنگاوێکی زۆر گرنگە پێویستە ئێستا ئێمە پێی هەڵستین بۆ ئەوەی هاوکاری لیبراڵەکان بکەین تاوەکو لە کۆمەڵگەکانیان میسداقیەت بەدەست بێنن و هەروەها میسداقییەتی خۆشمان لای ئەوان بەدەست بێنینەوە.

لە دواشیکردنەوەدا، دڵسۆزی نەخشەکانی ئەمەریکا تەنیا دوای تێپەڕینی کات بەدیاردەکەوێت، ئەمەش لە رێگەی ستراتیژییەتێکی راستگۆیانە و خاوەن مسداقییەتی دیموکراسییانەی وا کە بە

مرونەتەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو رێکارە سەختانە بکات کە لە ئێمە و لە دۆستە عەرەبە پێشووەکانمان پێویستن هەروەها توانا زۆرەکانی ئەمەریکا بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو ڕێکارالنە بە باشی هەڵبژێردرێن.

ئەگەر ئەمەریکا هەوڵ بدات بەوە خۆی لە هەڕەشەی ئیسلامییەکان بپارێزێت بەوەی بێ یەك و دوو بە پیر نیازی رژێمە عەرەبییەکانەوە بچێت لەسەرکوتکردنی داخوازییە بێ ئەملاوئەولاکانی گەلەکانیان، ئەمە جگە لە پاشەکشێیەکی گەورە کە یادەوەرییەکی تاڵی پاشگەزبوونەوە و خیانەتکردن لەگەڵ لیبراڵەکان چی دیکەی لێ ناکەوێتەوە، تاکە سیاسەتێکیش کە سەرکەوتوو بێت و توانای مانەوەی هەبێت بریتییە لە پاڵپشتییەکی بەردەوام و تا سەری لیبراڵە عەرەبەکان و ئەو ئایندەیەی کە ئەوان نوێنەرایەتی دەکەن.


## سوپاس و پێزانین

زۆر سووپاسی ئەم بەڕێزانە دەکەم کە لەم کارە هاوکارییان کردم :





– برای رۆژنامەنووس (فەرهاد محەممەد) کە لە ئەنتەرنێت بابەتەکەی بۆ ڕاکێشام

– برای تایپێست و نەخشەسازی لێهاتوو(سەنگەر شنۆیی) کە ئەرکی تایپکردن و نەخشەڕێکردنی لە ئەستۆ گرت

– دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان کە ئەرکی لە چاپدانی نامیلکەکەی بە ئەستۆ گرت .